

# موحەممەد صلى الله عليه وآله وسلم...

# ڕێبازی ژیان



ڕێکخراوی قوتابیانی کوردستان -kso

پرۆژەی "دۆستانی موحەممەد ﷺ..." بەهاوکاری خێرخوازان



# موحەممەد ﷺ .....

# ڕێبازی ژیان



ڕێکخراوی قوتابیانی کوردستان KSO
پرۆژەی "دۆستانی موحەممەد(ﷺ)"، بە هاوکاریی خێرخوازان



بسم الله الرحمن الرحيم

(وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ)


ناوی کتێب: موحەممەد (ﷺ) ... ڕێبازی ژیان.

بابەت: ژیان و فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ)

ئامادەکار: ڕێکخراوی قوتابیانی کوردستان ـ KSO

جۆر: پڕۆژەی دۆستانی موحەممەد (ﷺ).

ڕاوێژکار: یاریدەدەری پڕۆفیسۆر، د. سەباح بەرزنجی.

تیراژ: ٨٠,٠٠٠ هەشتا هەزار دانە.

دیزاینی بەرگ: سەیوان سەعیدیان.

دیزاینی ناوەوە: کەیوان عەبدوڵڵا ـ عیرفان عوسمان.

ساڵی چاپ: ٢٠٠٨ ـ ١٤٢٩ك

چاپخانە: حاجی هاشم ـ هەولێر

ئەرکی چاپ: لەسەر ئەرکی خێرخوازان چاپ کراوە.

شێوازی بڵاوکردنەوە: بەدیاری دەبەخشرێت و نافرۆشرێت.

ژمارەی سپاردن: ژمارە (٦٢٣)ی ساڵی ٢٠٠٨ی وەزارەتی ڕۆشنبیری پێدراوە

## ئەم کتێبە:

ئەم کتێبە بەرهەمی هەوڵ و ماندووبوون و شەونخونی سەدان کوڕو کچی دڵسۆزی ئاینی پیرۆزی ئیسلام و ڕێبازی موحەممەد(ﷺ)ەو مەکتەبی سکرتارییەتی (ڕێکخراوی قوتابیانی کوردستان) لە هەردوو مانگی سەفەرو ڕەبیعی یەکەمی ساڵی(١٤٢٩)ی کۆچی بەرانبەر شوبات و ئازاری(٢٠٠٨)ی زاینی و (٢٧٠٨)ی کوردی لە چوارچێوەی" پرۆژەی دۆستانی موحەممەد (ﷺ) بۆ چاپکردن و بڵاوکردنەوەی ١٠٠،٠٠٠ سەد هەزار پۆستەرو نامیلکەی تایبەت بە ژیانی پێغەمبەری ئیسلام(ﷺ)" بە هاوکاری خێرخوازان و مسوڵمانان لە سەرتاسەری کوردستان بەڕێوەی برد.

## پێشکەشی دەکەین بە:

هەموو ئەوانەی پێغەمبەری ئیسلام موحەممەد(ﷺ)یان خۆشدەوێت و بە زیندووکردنەوەی ڕەوشت و سوننەتە بەرزو بەڕێزەکانی خۆشەویستیی خۆیان بۆ ئەو سەروەرە ئاشکرا دەکەن و هەنگاو بە هەنگاو بە دوای ڕێنموونییەکانیدا دەڕۆن و وەك چرایەك فەرموودەکانی بەکاردەهێنن و بەهۆیانەوە خۆیان و هاوڕێ و کەس وکار و گەلەکەیان لە تاریکاییەکانی دونیاو دوارۆژ ڕزگار دەکەن.

- سەرجەم قوتابیان و گەنجانی کوردستان بە کوڕو کچەوە، بە تایبەت ئەوانەی دەیانەوێت خۆیان ڕاستییەکان لە بارەی پێغەمبەری ئیسلامەوە بزانن و لە لێکۆڵینەوەو گەڕانی بەردەوامدان تا دەگەنە حەقیقەتی ئەو پێغەمبەرەی کە گەورەترین پەیامی ڕزگاری و خۆشبەختی بۆ مرۆڤەکان هێنا..
- بە هەموو خوێنەرانی پێشکەشە.

ڕێکخراوی قوتابیانی کوردستان
مەکتەبی سکرتاریەت
٢٠٠٨/٣/١٩



## کورتەیەک لە ژیانی
## سەروەرو پێشەوامان موحەممەد (ﷺ)

**ناوی تەواوی:** موحەممەد (ﷺ)، کوڕی عەبدوڵڵا کوڕی عەبدولموتەلیبی کوڕی هاشمی قورەیشیە لە بنەماڵەی هاشم، بە چەندین پشت دەچێتەوە سەر گەورەمان ئیبراهیم پێغەمبەر (سەلامی خوای لێبێت)، هاشم یەکێکە لە باپیرانی موحەممەد(ﷺ) کە هەر لە دێر زەمانەوە زێوانی کەعبەی پیرۆزی بە دەست بووە.

**دایکی:** دایکی پێغەمبەرمان(ﷺ) ئامینەی کچی وەهەبی کوڕی عەبدولمەنافی کوڕی زەهرەی کوڕی قوسەی کوڕی کیلابە، لەگەڵ باوکیدا لە کیلابدا یەکدەگرنەوە.

**ڕۆژی لە دایکبوونی:** پێغەمبەرمان(ﷺ) ڕۆژی دووشەممە لە (٩ یان ١٢)ی ڕەبیعی یەکەمی ساڵێك کە بە ساڵی فیل ناسراوە، بەرامبەر بە (٥٧١/٤/٢٢) ی زایینی لە شیوی بەنی هاشم لە مەککەی پیرۆز لە دایکبووە. پێش لە دایکبوونی باوکی کۆچی دوایی دەکاتو باپیری ناوی لێدەنێت (موحەممەد).

## گەورەبوونی و تەمەنی هەرزەکاری

موحەممەد(ﷺ) بە منداڵی درا بە دایەنێك بەناوی (حەلیمەی کچی زوئەیب) لە نەوەی بەنی سەعد بۆ ئەوەی لە ژینگەی پاکی لادێ گەورە ببێت. موحەممەد(ﷺ) هێشتا منداڵ دەبێتو لە تەمەنی شەش ساڵیدا تاقە ئومێدەکەی واتە خاتوو ئامینەی دایکی کۆچی دوایی دەکات، پاشان عەبدولموتەلیبی باپیری ئەرکی بەخێوکردنی ئەم منداڵەی دەکەوێتە ئەستۆ کە جیهان چاوەڕێیەتی، لە تەمەنی هەشت ساڵیدا عەبدولموتەلیبی باپیریشی کۆچی دوایی دەکاتو



سەرپەرشتیکردنی ئەم منداڵە بێ نازە دەکەوێتە دەست ئەبوتالیبی مامی‌و بۆ ماوەی چل ساڵ وەك منداڵەکانی خۆی سەرپەرشتی دەکات. خۆشەویستمان هێشتا تەمەنی پانزە ساڵ دەبێت پاش شەڕی (فوججار) بەشداریکرد لە پەیمانێکدا کە بە پەیمانی (فضول) ناسراوەو لە نێوان خێڵەکانی قورەیش بۆ پاراستنی ئاسایش‌و ئەمنیەتی شاری مەککە بەسترا. لە تەمەنی بیست بۆ بیست‌و پێنج ساڵیدا دەبێتە بازرگان لای خاتوو خەدیجە، دەستپاکی‌و لێزانی موحەممەد (ﷺ) بە تەواوەتی خاتوو خەدیجە سەرسام دەکات‌و سەرنجی ڕادەکێشێت بۆیە لە ڕێگەی نەفیسە (کە دەستە خوشکی خەدیجە بوو) داوای ئەوەی لێدەکات کە مارەی بکات، بەمجۆرە موحەممەد (ﷺ) لەتەمەنی ٢٥ ساڵیدا خەدیجەی بە ڕەوشت‌و داوێن پاك کە بێوەژنێکی تەمەن (٤٠) ساڵ بوو مارە دەکات، بۆ ماوەی ٢٥ ساڵ لەگەڵ خاتوو خەدیجەدا ژیانی هاوسەرییان گوزەراند وەك نمونەترینی خێزانە بەختەوەرەکانی جیهان.

## دەرکەوتنی چرای ژیان و هاتنە خوارەوەی وەحی

کاتێك تەمەنی موحەممەد (ﷺ) لە(٤٠) ساڵی نزیك دەبێتەوە بۆ ماوەیەك لە ئەشکەوتی (حيراء)دا خەریکی پەرستش‌و عیبادەت دەبێت، تا ئەوە بوو لە تەمەنی چل ساڵیدا، خوای گەورە لە ڕێگەی جوبرەئیلەوە(فریشتەی وەحی) قورئانی بۆ دەنێرێتە خوارەوەو دەرگای ڕووناکی بە ڕووی تاریکاییەکانی ژیاندا دەکرێتەوە.



# یەکەمین وشە، یەکەمین ئاوازی ڕزگاربوون

فریشتەی نێردراو لەلایەن خوای گەورەوە(جوبرەئیل) بە موحەممەدی نەخوێندەوار دەڵێ بخوێنە، ئەویش دەڵێ من خوێندەوار نیم، بخوێنە، من خوێندەوار نیم:
بسم الله الرحمن الرحيم: (اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ).....، بەمجۆرە ئەم وشە پیرۆزە(اقْرَأْ) دەبێتە یەکەمین ئاوازی ڕزگاربوونی مرۆڤەکان لە دەست جەهلو نەزانیو تاریکاییەکان، دەبێتە سەرەتای دابەزینی نیگای خواییو نیشانەکانی پێغەمبەرایەتی تێدا دەدرەوشێنەوە، پاش گەڕانەوەی لە ئەشکەوتو دابەزینی نیگا(وەحی) بۆ موحەممەد(ﷺ)و بوونی بە پێغەمبەر، خەدیجەو عەلیو زەیدو ئەبوبەکر (خوایان لێڕازی بێت) باوەڕ بە پەیامەکەی دێننو دەبنە سەرەتاکانی ئەو کاروانەی کە تا ڕۆژی دوایی بەردەوامە، لەو کاتەشەوە کەوتە بانگەوازکردنی خەڵکو لەناوبردنی زوڵمو ستەمو بانگکردنی خەڵکی بۆ ڕێگای هیدایەتو پشت کردنە ڕێگاکانی بتپەرستیو ئارەزووپەرستیو مرۆڤپەرستی.
لە سەرەتای بانگەوازەوە قورەیشییەکان بە تەواوەتی کەوتنە پیلانگێڕانو ئاژاوە نانەوەو ڕێگەگرتن لە موحەممەد (ﷺ)و هاوەڵانی تا کار گەشتە ئەوەی ئەنجومەنێك پێکبهێنن بۆ ئەوەی نەیەڵن لە مەوسیمی حەجدا ئەو خەڵکانەی لە دەرەوەی مەککەوە دەهاتن بۆ بەجێهێنانی حەج گوێ لە موحەممەد (ﷺ)بگرن. بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) لە ساڵی پێنجەمی پێغەمبەرایەتیدا فەرمانیکرد بە کۆچی یەکەمی هاوەڵان کە پێکهاتبوون لە ١٢ پیاوو ٤ ئافرەت بەسەرۆکایەتی عوسمانی کوڕی عەفان (ڕەزای خوای لەسەر) بۆ وڵاتی حەبەشە، بۆ خۆڕزگارکردن لەو چەوساندنەوەیەی مسوڵمانان کە لە لایەن قورەیشییەکانەوە توشی بووبوون.



## ڕێگریی نوێنەرانی تاریکی و ستەم و چەوساندنەوە

موشریکەکانی مەککە بەردەوام لە هەوڵی ئەوەدابوون موحەممەد (ﷺ) پاشگەزبکەنەوە لە پەیامەکەی، بۆیەش چوونە لای ئەبوتالیبی مامی‌و گلەییان لە پێغەمبەر(ﷺ)کرد، ئەویش بە پێغەمبەری خوای ڕاگەیاند کە قورەیش داوای وازهێنان دەکەن لە بانگەوازەکەی، پێغەمبەریش (ﷺ) لەوەڵامدا فەرمووی "بە خوا ئەگەر خۆر لە دەستی ڕاستم‌و مانگ لە دەستی چەپم دابنێن بۆ ئەوەی دەست لە بانگەواز هەڵگرم هەرگیز کاری وا ناکەم تا سەرکەوتن بە دەست دێنم یان لەو پێناوەدا گیانم ئەبەخشم".

لەساڵی شەشەمی پێغەمبەرایەتیدا نەبەردترین‌و بەهێزترین پیاوانی مەککە مسوڵمان بوون کە ئەوانیش (حەمزەی کوڕی عەبدولموتەلیب‌و عومەری کوڕی خەتتاب) ڕەزای خوایان لێبێت، بوون. ئەم هەواڵەش دەنگۆیەکی گەورەی لە ناو کافراندا دایەوەو سەرشۆڕو زەلیلی کردن‌و پۆشاکی بڵندی‌و پایەبەرزی‌و ئاسودەیی بە مسوڵمانان بەخشی.

## ئابڵوقەیەکی توند بۆ سەر پێغەمبەر(ﷺ)و یارانی

لە پێناو فشارخستنە سەر پێغەمبەر(ﷺ)و یارانی‌و ترساندنی خزمەکانی بۆ ئەوەی پشتیوانی پێغەمبەر(ﷺ) نەکەن‌و بتوانن لە ناوی بەرن، هەموو قوڕەیش لە شیوی (ئەلموحسەب)دا کۆبوونەوە بۆ ئەوەی پەیماننامەیەك مۆرکەن کە تیایدا هەموو پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتی‌و ئابوری‌و هەمەلایەنە لەگەڵ بەنی هاشم‌و بەنی عەبدولموتەلیبدا بپچڕێنن کە پشتیوانی پێغەمبەر(ﷺ) بوون. ئەم ئابڵوقەیەش ماوەی سێ ساڵی خایاندو سەرجەم مسوڵمانەکان‌و



ئەوانەی پشتیوانی لێ دەکردن لە شێوی ئەبو تالیبدا چەرمەسەری و ناڕەحەتییەکی زۆریان چەشت تەنانەت کار گەشتە ئەوەی گەڵای دار لە بری خواردن بخۆن، تا خوای گەورە دەرووی لێ کردنەوەو بەبێ ئەوەی لە ماوەی ئەو سێ ساڵەدا کەمترین تەنازول لە بیرو باوەڕەکەیان بکەن کۆتایی بە ئابلۆقەکە هات و پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆژبەڕۆژ وێڕای ئەوەی بتپەرستانی قورەیش شێوازی دژایەتی و ڕووبەڕووبوونەوەیان توندتر دەکرد سورتر دەبوو لەسەر گەیاندنی پەیام و بانگەوازەکەی.

## ساڵی دڵتەنگی موحەممەد(ﷺ)

لە ساڵی دەیەمی پێغەمبەرایەتیدا، تاقە هیوای پێغەمبەر(ﷺ) کە هەمیشە بەرگری لێ دەکردو لە موشریکەکانی قورەیش دەیپاراست، واتە ئەبو تالیبی مامی کۆچی دواییکرد. هەر ئەو ساڵەو پاش کۆچی دوایی ئەبوتالیب، خەدیجەی خێزانی ئەوەی کە لە یەکەمین چرکەکانی بانگەوازەکەیەوە وەکو کۆڵەکەیەک وابوو بۆی، پشتی دەگرت و هانیدەداو لە ڕۆژانی خەم و پەژارەدا دڵ نەوایی دەکردو ئومێدی پێ دەبەخشییەوە، کۆچی دوایی کرد. بۆیە ئەمساڵە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) بووە ساڵی دڵتەنگی.

## بانگەواز پەرە دەسەنێت و گەشە دەکات

بانگەواز ڕۆژبەڕۆژ پەرەی دەسەندو دەنگی دەدایەوە تەنانەت لە دەرەوەی مەککەش هەواداری پێغەمبەر(ﷺ) پەیدابوون، تا لە ساڵی ١٢ی پێغەمبەرایەتیدا وەفدی شاری یەسریب (مەدینە)لەگەڵ مسوڵمانانداا بە سەرۆکایەتی پێغەمبەر(ﷺ) پەیمانی عەقەبەی



یەکەمیان لەسەر پارێزگاریو پشتیوانیکردنی مسوڵمانانو پێغەمبەر ئیمزا کرد. لە ساڵی ١٣ی پێغەمبەرایەتیدا (٦٢٢ ی زایینی) پاش پەیمانی عەقەبەی دووەم کە تیایدا حەفتاو سێ پیاوو دوو ژنی یەسریب (مەدینە) پەیمانیاندا بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەر گوێڕایەڵیو شوێنکەوتنیو بەرگری لێکردنیو پشتیوانیکردنی، مسوڵمانان پۆل پۆل بەرەو مەدینە کۆچیان کرد، یەکەم کەسیش کۆچی کرد ئەبوسەلەمەو کورەکەی بوون، ئەگەرچی ئەبوبەکریش ویستی کۆچ بکات بەڵام پێغەمبەر(ﷺ)ڕێی پێنەداو فەرمووی "پەلەمەکە تا خوا مۆڵەتم پێدەدات، پێکەوە کۆچ دەکەین". هەر لەو ڕۆژانەشدا موشریکەکان لە پەرلەمانی مەککە (دار الندوة) کۆبوونەوەو پیلانی تیرۆرکردنی پێغەمبەریان دارشت بە پێشنیاری ئەبوجەهلی کوڕی هیشام، لە هەر تیرەیەك گەنجێکی لێهاتوویان هەڵبژارد بۆ ئەوەی هەر یەکێکیان شمشێرێکی لێبدەنو خوێنەکەی نەکەوێتە سەر کەسیان، بەڵام خوای پەروەردگار لە ڕێگەی جوبرەئیلەوە پێغەمبەری(ﷺ)ئاگادار کردەوەو مۆڵەتی کۆچکردنی پێدا بەرەو مەدینە.

## کۆچ بەرەو مەدینەو بنیاتنانی یەکەمین دەوڵەتی مەدەنی

پاش ئەوەی کەس نەمایەوە لە مسوڵمانان کۆچ بکاتو هەموویان بەرەو مەنزڵگا نوێیەکەیان ملی غەریبایەتییان گرتە بەر بەرەو هەوارگە نوێیەکەیان، پێغەمبەرمان(ﷺ) لە گەڵ ئەبوبەکر لە شەوی ٢٧ی صەفەری ساڵی ١٤ی پێغەمبەرایەتی لە ماڵ دەرچوونو کۆچیان کرد بۆ مەدینەو خوای گەورە بە ویستی خۆی لە شەڕی دوژمنەکانی پاراستیی. دوای مانەوەیان بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك لە ڕێگاداو لە ئەشکەوتی (سەور)، هەموو هەوڵەکانی قورەیش لەگەڕان بەدوایاندا بێئاکام بوونو لە ٨ ی ڕەبیعی یەکەمی ساڵی ١٤ ی پێغەمبەرایەتیدا گەیشتنە شاری مەدینە.



## دروستکردنی مزگەوت
## یەکەمین کاری پێغەمبەرمانە(ﷺ)

لەگەڵ گەشتنی بە مەدینە پێغەمبەری خوا (ﷺ)یەکەم کارێك كردی دروستکردنی مزگەوتی (قوبا) بوو. پێغەمبەری خۆشەویست وەك مرۆڤێکی خاکیو ئاسایيو وەك هەر تاکێکی ئەم کۆمەڵگە نوێیە بەشداریکرد لە دروستکردنی مزگەوتەکەداو بە دەستی پیرۆزی خۆی دیوارەکانی لەگەڵ هاوەڵەکانیدا هەڵچنی.

## دۆخێکی نوێ، ژیانێکی نوێ

پێغەمبەری خۆشەویستمان(ﷺ) بە گەشتنی بۆ مەدینەی بنکەی بانگەوازو دەوڵەتە پڕ لە دادەکەی لە نێوان مسوڵمانەکانو جولەکەکاندا دەستورێکی نوسیو لەو دەستورەدا مافی هەر کەسو لایەنو تائیفەیەك لە ژیانو ئازادی پارێزراو بوو.

## ڕزگارکردنی مەککەی زێدی باب و باپیری

لە ساڵی هەشتەمی کۆچیدا پێغەمبەری خوا (ﷺ)سوپایەکی ئامادەکردو بەرەو مەککە بەڕێکەوت بە مەبەستی ڕزگارکردنی، لەگەڵ گەشتنی بە مەککەش تەشریفی بردە کەعبەی پیرۆزو تەوافی کردو (٣٦٠) بتی ناو کەعبەی شکاندو فەرمووی " (وَقُلْ جَاء الْحَقُّ وَزَهَقَ الْبَاطِلُ إِنَّ الْبَاطِلَ كَانَ زَهُوقاً) (الإسراء : ٨١ ) "، پاشان فەرمانیکرد بیلال بانگبداتو نوێژی فەتحی ئەنجامدا. لە ڕۆژی دووەمی فەتحیشدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتارێکی بەپێزی پێشکەشی مسوڵمانان کردو بۆ ماوەی ١٩ ڕۆژ لە مەککەدا مایەوەو فەرمانی تازەکردنەوەی پایەکانی کەعبەی پیرۆزیداو ئەو کارەشی بە ئەبو سەعیدی خوزاعی سپارد.



## کۆچی دوایی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ

پاش ٢٣ ساڵ تێکۆشان و فیداکاری، پاش ماندووبوون و شەونخونی بەردەوام، پاش ئەو هەموو زەحمەتەی لە پێناو گەیاندنی بەرنامەکەی خوادا کێشای، چێشتەنگایەکی گەرمی ڕۆژی دووشەممەی ١٢ ی ڕەبیعی یەکەمی ساڵی ١١ی کۆچی لە تەمەنی ٦٣ ساڵیدا، پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەخۆش کەوت و ماوەی نەخۆشییەکەی ١٤ ڕۆژی خایاند و لە ماڵەکەی خاتوو عائیشە گیانی پاکی بەرەو فیردەوس گەڕایەوە، هەواڵی کۆچی دوایی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاوەڵانی بە تەواوەتی خەمبار کرد، فاتمە گریا و وتی "بابە گیان وەڵامی پەروەردگارت دایەوە کە بانگی کردی، بابەگیان فیردەوسی جەننەت جێگاتە، بابەگیان پرسە و سەرەخۆشی بۆلای جوبرەئیل ئەبەین"، ئەبوبەکری سدیق بە سواری ئەسپەکەی هات و خێرا چوویە ژوورەکەی عائیشە و پەردەی لەسەر تەرمەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لادا و ماچی کرد و دەستی کردە گریان، بەدەم گریانەوە فەرمووی: "دایک و باوکم بە قوربانت بن، هەرگیز نابێ کە دووجار بمری، تەنیا جارێکە و ئەوا ڕۆشتی"، ئینجا هاتە دەرەوە و بینی عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خوای لەسەر) بە تووڕەییەوە قسە دەکات وتی "دانیشە!"، دانەنیشت و پاشان ڕووی کردە خەڵکەکە و فەرمووی: "هەرکەسێک لە ئێوە موحەممەدی (ﷺ) دەپەرست وا موحەممەد مرد، هەرکەسێکیش خوای موحەممەدی (ﷺ) پەرستووە ئەوا خوای پەروەردگار زیندووە و هەرگیز نامرێت". پاش شۆردن و کفنکردن، هەر لە ماڵەکەی عائیشەدا قەبریان هەڵکەند و تەرمەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) یان بە خاک سپارد. هەزاران سڵاو و درود لەسەر ڕۆحی پاکت ئەی ئەو کەسەی هەموو ژیانی خۆت تەرخانکرد و هەموو تەمەنت بە چەرمەسەری و ناڕەحەتی و شەونخونی بەسەر برد بۆ ئاسودەیی مرۆڤوگەلانی دونیا و هەموویانت لە تاریکاییەکان ڕزگارکرد و چرای بەختەوەریت بۆ هەڵکردن.



## لاوێتی لە چیدا بەسەر دەبەی؟

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود(خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) دەفەرموێت:" مرۆڤ لەڕۆژی دواییدا لەبەردەم خوای گەورەدا ڕادەوەستێو ناجوڵێ تا پرسیاری لەبارەی پێنج شتەوە لێ نەکرێت: تەمەنی، لە چیا بەسەری برد؟. لاوێتی، لەچیدا پیری کرد؟. ماڵەکەی، لە کوێ بەدەستی هێناو لەچیدا خەرجی کرد؟. لەو زانستەی کە هەیبوو، چ کردەوەیەکی پێ کرد؟"

## ڕێگای زانست، ڕێگای بەهەشتە

ئەبو هورەیرە (ڕەحمەتی خوای لەسەر) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) فەرمویەتی"هەرکەس ڕێگایەك بگرێتە بەر بۆ فێربوونی زانست، خوای گەورە ڕێی چوونە بەهەشتی بۆ ئاسان دەکات".

## فریشتەکان دوعا بۆ زانستخوازان دەکەن

- ئەبو دەرداء (ڕەحمەتی خوای لەسەر) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) فەرمویەتی " کاتێ فریشتەکان کەسێك دەبینن بەدوای زانستو زانیاریدا دەڕوات باڵی بۆ ڕادەخەن لەبەر پێخۆشبوونو ڕازی بوون لەسەر ئەو کارە، ئەوانەی لە ئاسمانەکانو زەمیندانو تەنانەت ماسییەکانی دەریاش داوای لێخۆشبوونی بۆ دەکەن لای خوای گەورە، ڕێزو قەدرو پایەی زانا بەسەر خودا پەرستێکدا وەك پلەو قەدری مانگ وایە بەسەر ئەستێرەکانی دیکەدا، زانایان میراتگرانی پێغەمبەران، میراتی پێغمبەران نە دینار بووە نەدرهەمو نە زێڕو زیو، بەڵکو زانست بووە، بەڕاستی ئەو کەسەی ئەم میراتەی بەر بکەوێت ئەوە پشكو بەشی زۆر گەورەی پێ گەشتووەو گەورەترین بەختەوەریی بەرکەوتوە".



## زانست و یادی خوا پلەیەکی بڵندیان هەیە لای خوای گەورە

ئـەبو هـورەیرە(ڕەزای خـوای لەسـەر) دەگێڕێتـەوە، پێغەمبـەری خۆشەویـست (ﷺ) فەرمویـەتی "دونیا نـەفرەت لێ کراوەو ئـەوەش لەودایە نەفرین لێکراوە، تەنها دووشت نەبێت، یەك: یادو زیکری خواو ئـەوەی دەبێتـە هـۆی ڕەزامەنـدی خـوای گـەورە، دووەمـیش زانـاو فێرخواز".

## گەڕان بە دوای زانستدا لەسەر کێ پێویستە؟

ئەنەس (ڕەزای خوای لەسـەر) دەگێڕێتـەوە، پێغەمبـەری ئـازیز (ﷺ) فەرمویـەتی:"چـوون و گـەڕان بـەدوای زانـستو وەرگـرتنی زانـستدا پێویستە لەسەر هەموو مسوڵمانێك".

## سەروەرمان سەلام لە منالان دەکات و سۆزو خۆشەویستییان پیشاندەدات

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەحمـەتی خـوای لەسـەر) کـە بـەلای منداڵانـدا تێدەپەڕی سـەلامی لێ دەکـردن و دەیفـەرموو "جارێکیـان لـە خزمـەت پێغەمبـەری ئـازیزدا (ﷺ) بـووم، بـەلای کۆمەڵـە منداڵێکدا تێپـەڕیو سەلامی لێ کردن"

## کێیە سۆزو بەزەیی تیا نییە؟!

عائیـشەی دایکـی بـڕواداران (ڕەزای خـوای لەسـەر) دەفـەرموێت:" بابایەکی دەشتەکی هاتە خزمەت پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) عەرزی کرد: (ئێوە منالـەکانتان مـاچ دەکـەن؟ ئێمـە هـەرگیز منـداڵ مـاچ ناکـەین). پێغەمبەری ئـازیز (ﷺ) فـەرموی: مـن دەسـەڵاتم چییە کاتێ خـوای گەورە سۆزو بەزەیی لە دڵی ئێوە دەرهێناوە".



## ئاكاری بەرز بڕواتەواوییە
## چاكترین كەس ئەوەیە لەگەڵ خێزانەكەی چاكە

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لەسەر) دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) فەرمویەتی "ئەو بڕوادارانە بڕوایان كامڵو تەواوترە كە خوو ئاكاریان جوانو بەرزترە، هەروەها چاكترینو باشترینیشتان ئەوانەتانن كە باش بن لەگەڵ خێزانو هاوسەری خۆیاندا".

## دونیاو بایەخی لای پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەحمەتی خوای لەسەر) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) فەرمویەتی:"بەڕاستی دونیاو ماڵی دونیا میوەی سەوزی دلگیرو شیرینو خۆشە، خوای گەورە ئێوەی كردووە بە جێگەدار تێیدا تا بزانێ كارو كردارتان چۆنە؟".

## كەس شانازی بەسەر كەسدا نەكات

عەیازی كوڕی حیار (ڕەحمەتی خوای لەسەر) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) فەرمویەتی:" خوای گەورە نیگای (وەحی) بۆ كردووم كە خاكی بنو خۆتان بەكەم بگرن، بە جۆرێك كە كەس شانازی بەسەر كەسەوە نەكاتو كەس زۆرو ناهەقی لەكەس نەكات".

## دادوەران شوێنیان لەسەر مەشخەڵی نورە

عەبدوڵلای كوڕی عەمر (ڕەحمەتی خوای لەسەر) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) فەرمویەتی "دادگەرانو دادپەروەران لە ڕۆژی پەسلاندا(ڕۆژی دوایی) لە خزمەت پەروەردگاردا شوێنیان لەسەر



مەشخەڵی نووره، ئەمانەش ئەو کەسانەن کە دادپەروەرن لە بڕیاردانداا، لەگەڵ ماڵو منداڵیانداو ئەوی لە ژێر دەستیاندا بووه".

ـ بورەیدە (ڕەحمەتی خوای لەسەر) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) فەرمویەتی:"دادوەران سێ جۆرن، یەکێکیان لە بەهەشتدایەو دووانیان لەناو ئاگردان، ئەوەی کە لە بەهەشتدایە کەسێکە حەقی ناسیوەو بەو حەقە داوەری کردووە، ئەوەی کەحەقی زانیوەو خۆی لێ لاداوە، لەئاگردایە، ئەوەی داوەری بۆ خەڵکی دەکات بە نەزانی ئەوە لە ئاگردایە".

## ئێوە لە ئادەمن، ئادەمیش لە خاک

ئەبو هورەیرە (ڕەحمەتی خوای لەسەر) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) فەرمویەتی:" خوای گەورە شانازی بەکەسو کارو خۆ بە گەورە زانینو خۆ بە زیاتر لە خەڵك زانینی لێ لاداون، مرۆڤ یا بڕوادارێکی لەخوا ترسە (کە دەبێت خاکیو بێ فیز بێت)، یا تاوانکارێکی سنوور بەزێنە (کە سەرشۆڕی دیوانی خوایە)و زەلیلی قیامەتە. ئێوە لە ئادەمن، ئادەمیش لە خاك".

## کامیان گرنگترە:
## ڕووکەش یان ناوەڕۆک و کردەوە؟

ئەبو هورەیرە(ڕەحمەتی خوای لەسەر) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) فەرمویەتی "خوای گەورە تەماشای شکڵو شێوەو ڕووکەشی دەرەوەتان ناکات، بەڵکو تەماشای نیازی دڵو دەروونو کردەوەتان دەکات".



## لێبوردن سەربەرزییە

ئەبو هەرەیرە(ڕەزای خوای لەسەر) دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی:"بەخشین هیچ کاتێک سەرمایە کەم ناکاتەوە، هەر بەندەیەک لێبوردنێک بنوێنێت خوای گەورە زیاتر سەربەرزی دەکات، هەروەها هەر کەسێکیش لەبەر خوا ملکەچی بنوێنێت خوای گەورە پلەو پایەی بەرز دەکاتەوە".

## ڕەوشتی ئیسلام شەرم و شکۆیە

زەید کوڕی ڕوکانە ئەفەرموێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی "بۆ هەموو ئاینێك ڕەوشتێك هەیە، ڕەوشتی ئیسلام شەرمو شکۆیە".

## گەنجانێک لە ژێر سێبەری عەرشی خوادان

ـ ئەبو هورەیرە (ڕەحمەتی خوای لەسەر) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) فەرمویەتی "حەوت گروپ هەن خوای گەورە لە ڕۆژی دواییدا دەیانخاتە ژێر سێبەری عەرشی خۆیەوە لە کاتێکدا هیچ سێبەرێك نییە تەنها سێبەری ئەو نەبێت: پێشەواو سەرکردەیەکی دادپەروەر، لاوێك لە خواپەرستیدا قاڵ بوبێتو پێگەشتبێت، پیاوێك دڵی هۆگری مزگەوت بێت، دوو کەس لەبەر خوا یەکدییان خۆش بوێت، لەسەر ئەو خۆشەویستییە کۆ ببنەوەو لەسەر ئەویش جودا ببنەوە، پیاوێك ئافرەتێکی خانەدانی شۆخو جوان بانگی بکات بۆ ئیشی خراپە، بەڵام ئەم بڵێ من لە خوا دەترسمو لەبەر خوای گەورە لێی گەڕێو وازی لێ بێنێ، پیاوێك خێرێك بەدەستی ڕاستی بکات دەستی چەپی پێی نەزانێ هێندە بە پەنهانو دوور لە چاوی خەڵکی بیکات، پیاوێك بە تەنهایی یادی خوا بکاتو چاوەکانی پڕ بن لە ئەسرین لە ترسی خوای گەورەدا".





## سود لە پێنج شت وەرگرە، بەر لەوەی پێنج شت بەرۆکت بگرن

عەبدوڵڵای کوڕی عەباس(ڕەحمەتی خوای لەسەر) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمویەتی:"سود لە پێنج شت وەرگرە پێش پێنج شتی تر: سود لە ژیانت وەرگرە بەر لە مردنت، سود لە لەشساغیو تەندروستیت وەرگرە بەر لە نەخۆشیت، سود لە کاتە بەتاڵەکانت وەرگرە بەر لە سەرقاڵیت، سود لە تەمەنی گەنجایەتیت وەرگرە بەر لە پیریت، سود لە دەوڵەمەندیت وەرگرە بەر لە هەژاریت".

## خوا مرۆڤی نەرم و نیانی خۆشدەوێت

دایکی ئیمانداران عائیشە(ڕەزای خوای لەسەر) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمویەتی "ئەی عائیشە بەڕاستی خوا نەرمو نیانەو نەرمو نیانیشی خۆشدەوێت، ئەوەی لە نەرمو نیانیدا دەیبەخشێ لە توندو تیژیدا نایبەخشێت، لە هیچ بارودۆخێکی تریش نایبەخشێت"، واتە خوای گەورە ئەوەی لە کاتی نەرمو نیانی مرۆڤەکاندا دەیبەخشێت لە ڕزقو ڕۆزی و لێخۆشبوون لە هیچ کاتێکی تردا پێیان نابەخشێت.

## ئاسانکارو مژدە بەخش بن

ئەبی موسای ئەشعەری (ڕەزای خوای لەسەر) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر(ﷺ) مەعازی کوڕی جەبەلی نارد بۆ یەمەن پێی فەرموو:" ئاسانکاری بکەنو شت قورس مەکەن، موژدەبەخش بنو خەڵکی دوور مەخەنەوە، گوێڕایەڵی یەکتر بنو لە نێو خۆتاندا ناکۆک مەبن".



## لەسەر هاوکاری کردنی خەڵکی چوویە بەهەشتەوە

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لەسەر) دەفەرموێت:پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:"پیاوێک بەلای چڵە دارێکدا تێپەڕی کە ناوەڕاستی ڕێگاکەی گرتبوو، وتی(سوێند بە خوا دەبێت ئەو چڵە دارە لا ببەم، هەتا ئازاری خەڵکی نەدات)، بەوە خرایە بە هەشتەوە".

## خۆتان لە پیسکردنی ڕێگاکان بپارێزن

ئەبو هورەیرە(ڕەزای خوای لەسەر) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمویەتی:" خۆتان بپارێزن لەو دوو نەفرەت کەرە، وتیان: ئەو دوو نەفرەت کەرە چین ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)؟، فەرموی: ئەوەی لەسەر ڕێگای خەڵکیو سێبەرەکاندا پیسی دەکات". واتە: پیسکردنی سەر ڕێگاکانو بن دارو درەختو سێبەرەکان لە ئیسلامدا نەهی لێکراوەو بەهۆیەوە خەڵکی نەفرەت لەبکەرەکانیان دەکەن.

## درەختێک بروێنە، واتە چاکەیەک بکە

جابری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خوای لەسەر) دەفەرموێت، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی:"هەر مسوڵمانێ درەختێك بروێنێ، ئەوا ئەوەی لێی دەخورێ بۆی دەبێت بە خێر، ئەوەشی لێی بدزێت هەر بۆی دەبێت بە خێر، ئەوەشی پەلەوەرو باڵندە لێی بخوات هەر بۆی دەبێت بە خێر، هەر کەسێکیش لێی ببات هەر بۆی دەبێت بە خێر".

## هاوڕێی چاک وەک هاوڕێیەتی عەتر فرۆش وایە

ئەبو موسای ئەشعەری، ڕەزای خوای لەسەر دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی "نمونەی هاوڕێی چاكو هاوڕێی خراپ وەکو هەڵگری میسكو کورەی ئاسنگەر وایە، هەڵگری میسك یا بەشت دەدات یان لێی دەکڕیت یان بۆنێکی خۆش دێت بەسەرتا، کورەی ئاسنگەر یا جلەکانت دەسوتێنێت یا بۆنێکی ناخۆش دێت بەسەرتا".



## کەم و کوڕییەکانی دوا ڕۆژت داپۆشە

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لەسەر) دەفەرموێت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەت:" هەر بەندەیەك کەمو کوڕی بەندەیەکی تر داپۆشێ لە دونیادا، خوای گەورە لە قیامەتدا کەمو کوڕییەکانی دادەپۆشێ".

## یارمەتی هەژاران بدە
## چونکە وەک بەڕۆژووبوونی هەمیشەیی وایە

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لەسەر) دەفەرموێت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی:" ئەو کەسەی یارمەتی بێوەژنو هەژار دەدات وەك ئەو کەسەیە کە جیهاد دەکات لە پێناوی خوادا، وەك ئەو کەسە وایە بەردەوام خەریکی شەونوێژ بێتو بێزار نەبێت لێی، هەروەك ئەو کەسە وایە بەردەوام بە ڕۆژوو بێتو نەیشکێنێت".

## سەردانی خزم و دۆست، هۆکاری زیادبوونی ڕزق و ڕۆزییە

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لەسەر) دەفەرموێت، بیستومە لە پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو:"هەر کەسێ پێی خۆشبێ ڕزقو ڕۆزی زیاد بکاتو تەمەنی درێژ بێتو شوێنەواری چاکی بمێنێتەوە، ئەوە با سەردانی خزمو دۆستانی بکات".

## پێغەمبەر (ﷺ) بۆ ڕەحمەت و میهرەبانی نێردراوە

ئەبو هورەیرە(ڕەزای خوای لەسەر) دەڵێ، بە پێغەمبەر (ﷺ) وترا: ئەی پێغەمبەری خوا دوعا لە موشریکەکان بکە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی:" من بە نەفرینکار نەنێردراوم، بەڵکو بە ڕەحمەتو میهرەبانی نێردراوم".



## خۆشەویسترینی کارەکان لای خوای گەورە

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود(خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت، پرسیارم لە خۆشەویستم پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) کرد: چ ئیش و کارێك لای خوای گەورە خۆشەویستە؟ فەرموی:"نوێژ لە کاتی خۆیدا، عەرزم کرد: چیتر؟ فەرموی: چاکە کردن لەگەڵ دایكو باوکدا، عەرزم کرد: چیتر؟ فەرموی: تێکۆشان لە پێناوی خوای گەورەدا".

## چاکە لەگەڵ دایک و باوکدا دەبێت چۆن بێت؟

- مالیکی کوڕی ڕەبیعەی ساعیدی(ڕەزای خوایان لێبێت) دەگێڕێتەوە، لە خزمەتی پێغەمبەری ئازیزدا (ﷺ) دانیشتبوین، پیاوێك لە بەنی سەلەمە هاتە خزمەتی و عەرزی کرد: ئایا چ چاکەیەك ماوە کە بیکەم لەگەڵ دایكو باوکم دوای مردنیان؟ پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) فەرموی: سەڵاوات دان لەسەریان، داوای لێخۆشبوون کردن بۆیان لای خوای گەورە، بە جێهێنانی وەسیەتو ئامۆژگارییان، بەجێهێنانی سیلەی ڕەحمێك کە لەڕێی ئەوانەوەیە، هەروەها ڕێزگرتنی هاوەڵو هاوڕێکانیان".

- ئەبو هورەیرە(ڕەحمەتی خوای لەسەر) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) فەرمویەتی:"مرۆڤ پلەی لە بەهەشتدا بەرز دەبێتەوەو دەڵێت ئەمەم چۆن دەستکەوت؟ دەوترێت بەهۆی دوعای خێرو داوای لێ خوشبونی منداڵەکەتەوەیە بۆ تۆ".

## گفتوگۆیەکی سەیر!

ئەنەس (ڕەحمەتی خوای لەسەر) دەگێڕێتەوە لە خزمەتی پێغەمبەری ئازیزدا (ﷺ) بووین پێکەنی، فەرموی: دەزانن بە چی پێدەکەنم؟



عەرزمان کرد: خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) زاناترن، فەرمووی: بەگفتوگوو ئاخاوتنی بەندەیەك لەگەڵ پەروەردگاریدا. بەندەکە دەڵێت: پەروەردگارا ئایا تۆ منت لە ستەمکردن نەپاراستووەو نەهیت لێ نەکردوم لەستەمکردن؟ خوای گەورەش دەفەرموێت، بەڵێ. عەرزی دەکات: دەی من ئەمڕۆ تەنها شاهێدم لە خۆم دەوێت بۆ شایەتیدان لە سەرم. فەرموی: خوای گەورە دەفەرموێت: ئەمڕۆ تەنها خۆت بەسە بۆ شایەتی دان دژی خۆت، فەرموی پاشان مۆر بە سەر دەمیدا دەنرێت، بە ئەندامەکانی لاشەی دەگوترێت: بە گۆ بێن‌و قسان بکەن، ئەندامەکانیش باسی کردەوەکانی دەکەن. پاشان فەرموی: ئیتر وازی لێ دەهێنرێت بۆ ئەوەی قسە بکات لەگەڵ ئەندامەکانی لاشەیدا. ئەو کەسە بە ئەندامەکانی لاشەی دەڵێت: دوو ڕوویی‌و تیا چوون بۆ ئێوە، من بەرگریم لە ئێوە دەکرد".

## ژیرو بەڕێزو هۆشیارەکان کامانەن؟

ئیبنو عومەر(ڕەحمەتی خوای لەسەر) دەگێڕێتەوە، لە خزمەتی پێغەمبەری ئازیزدا (ﷺ) بووین پیاوێکی ئەنساری هات‌و سڵاوی لە پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) کردو عەرزی کرد: کام بڕوادار بەڕێزترینە؟ پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) فەرموی:" ئەوەیان ئاکاری جوان بێت. پاشان عەرزی کرد: ئەی کامیان ژیرو هۆشیارە؟ فەرموی: ئەوەیان زیاتر بیرو یادی مردن دەکات‌و ئەوەیان چاکترو باشترە خۆی بۆ دوای مردن ئامادە دەکات، ئا ئەوانە ژیرو هۆشیارەکانن".

## پەنا لەچی بگرین بە خوا؟

زەیدی کوڕی سابت (ڕەحمەتی خوای لەسەر) دەگێڕێتەوە لەخزمەت پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ)دا بووین، سواری وڵاخەکەی بووبوو، بەناو باخی کابرایەکی بەنی نەجاردا دەڕۆشتین وڵاخەکەی



هەڵوێستەیەکی کرد کە خەریك بوو پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) بخاتە خوارەوە، سەیرمان کرد شەش یا پێنج یا چوار گۆڕی تێدا بوون، پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) فەرموی:" کێ ئەوانە دەناسێت؟ پیاوێك عەرزی کرد: من، پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ)فەرموی: ئەوانە کەی مردوون؟ عەرزی کرد: لەسەردەمی کافریو شیرکدا، پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) فەرموی: ئەم ئوممەتە لە گۆڕدا تاقی دەکرێنەوەو پرسیاریان لێ دەکرێت، گەر لەبەر ئەوە نەبوایە دەترسام مردوو نەخەنە گۆڕەوە لەخوای گەورەم دەخواست ئەوەی من دەیبیستم ئێوەش بیبیستن، پاشان پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) ڕوی تێ کردینو فەرموی: پەنا بگرن بە خوا لە ئاگری دۆزەخ، وتمان: پەنا دەگرین بە خوا لە ئاگری دۆزەخ. پاشان فەرموی: پەنا بگرن بە خوا لە سزای گۆڕ، وتمان: پەنا دەگرین بە خوا لەسزای گۆڕ. پاشان فەرموی: پەنا بگرن بە خوا لە ئاژاوە ئەوەی دیارەو بەرچاوەو ئەوەی نادیارو پەنهانە، وتمان: پەنا دەگرین بە خوا لەئاژاوە ئەوەی دیارەو بەرچاوەو ئەوەی نادیارو پەنهانە، پاشان فەرموی: پەنا بگرن بە خوا لە ئاشوبو فیتنەی دەجال، وتمان: پەنا دەگرین بە خوا لە ئاشوبو فیتنەی دەجال".

## فەرمان کردن بە چاکە

ئەبو سەلمان مالیکی کوڕی حووەیریس (ڕەحمەتی خوای لەسەر) دەگێڕێتەوە، هاتینە خزمەت پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) کۆمەڵە لاوێکی هاو تەمەن بووین، بیست شەو لە خزمەتیدا ماینەوە، بەڕاستی لە پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) میهرەبانترو نەرمو نیانترم نەبینیوە، وای گومان برد کە ئێمە بێتاقەتی خزمو کەسوکارمان بووین، پرسیاری لە بارەی ئەو کەسانەمان کرد کە لەوێ بەجێماون، ئێمەش باسمان بۆی کرد، فەرموی: بگەڕێنەوە بۆ لای کەسوکارتان

لەوێ بمێننەوە، فێریان بکەن‌و فەرمانیان پێ بکەن کە فلان نوێژ لە فلان کاتدا ئەنجام بدەن‌و لەو کاتەدا ئەوەندە ڕکات نوێژ بخوێنن، کاتێ کاتی نوێژ هات با یەکێکتان بانگ بداتو گەورەکەشتان پێش نوێژیتان بۆ بکات".

## خوای گەورە کام بەندانەی خۆش دەوێت؟

سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس(ڕەحمەتی خوای لەسەر ) دەگێڕێتەوە، بیستم پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) فەرمویەتی "خوای گەورە بەندەی لەخوا ترسی دەوڵەمەندی دەروونی‌و دڵ تێری شاراوەی خۆش دەوێت".

## ڕێزی هاوسەرەکانتان بگرن، چونکە پێغەمبەرمان وایکردووە

ئەسوەدی کوڕی یەزید دەگێڕێتەوە: لە عائیشەی دایکی بڕوادارانم پرسی (ڕەحمەتی خویان لەسەر)، "کاتێ پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) لە ماڵەوە دەبوو بە چییەوە سەرقاڵ دەبوو؟، فەرموی: خەریکی خزمەتی خێزانەکەی دەبوو، کە نوێژ بوایە دەچو بەلای نوێژەکەیەوە".

## ڕێگای بەهەشت کامەیە؟

جابری کوڕی عەبدوڵڵا(ڕەحمەتی خوای لەسەر) دەگێڕێتەوە، پیاوێک پرسیاری لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد: ئاگادارم کە، ئەگەر نوێژە فەرزەکان بکەم‌و مانگی ڕەمەزان بە ڕۆژوو بم‌و حەڵاڵ بە حەڵاڵ بزانم‌و حەرام بە حەرام بزانم، لەوە زیاتر هیچ نەکەم دەچمە بەهەشت؟ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموی:"بەڵێ".

## مافی ڕێگاکان بدەن

ئەبی سەعیدی خودری (ڕەزای خوای لەسەر) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموی:"نەکەن لەسەر ڕێگاکاندا دابنیشن، وتیان: ئەی



پێغەمبەری خوا(ﷺ) چارەمان نییەو شوێنی دانیشتنمانەو وتوێژی تێدا دەکەین، پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: ئەگەر هەر دەتانەوێ دانیشن ئەوا مافی ڕێگاکە بدەن، وتیان: مافی ڕێگا چییە؟، فەرموی: چاو دابخەنو خەڵکی ئازار مەدەنو وەڵامی سەلامی خەڵکی بدەنەوەو فەرمان بکەن بە چاکەو ڕێگری بکەن لە خراپە".

## دەوڵەمەندی چۆن دەبێت؟

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لەسەر) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمویەتی:"دەوڵەمەندی بە شتی زۆر نییە، بەڵکو دەوڵەمەندی ئەوەیە کە دڵو دەروونت دەوڵەمەند بێت".

## بچۆرە ناو باخ و میوەهاتی بەهەشت

ثەوبان (ڕەزای خوای لەسەر) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی:" مسوڵمان ئەگەر سەردانی برایەکی مسوڵمانی کرد ئەوا لە ناو باخو میوەهاتی بەهەشتدا دەبێت تا دەگەڕێتەوە".

## گرنگی و بایەخی دوا ڕۆژو کەمی بایەخی دونیا

ـ جابر (ڕەحمەتی خوای لەسەر) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) جارێکیان بە نێو بازاڕی مەدینەدا تێپەڕی، مسوڵمانانیش بەملاو ئەولای شانیدا دەڕۆشتن، دایان بەلای کەلاکی گیسکێکی کەڕیلەی مردارەوە بوودا، پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) دانەوییەوە گوێی گیسکەکەی گرتو فەرموی:" کامتان بە درهەمێك(پارەیەکی کەم) ئەم کەلاکەی دەوێت؟ عەرزیان کرد: قوربان بە بەلاشیش بماندەنێ نامان دەوێ، جا چی لێ بکەین؟"، پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) جارێکی تر فەرموی " پێتان خۆشە ئا ئەمە هی یەکێ لە ئێوە بێت؟، عەرزیان کرد: قوربان بەزیندوییش عەیبدارە،





نەخوازەڵا مرداریش بۆتەوە. پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) فەرموی: سوێند بەخوا دونیا لای خوای گەورە سووكو بێ نرخترە هەتا ئەم گێسکە لای ئێوە".

- ئەنەس (ڕەحمەتی خوای لەسەر) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) فەرمویەتی " لە ڕۆژی قیامەتدا کێ لە دونیادا زۆر خۆشی بووەو لە خۆشی دونیادا ژیاوە (واتە: دۆزەخییەك) دەیهێننو لە ئاگری هەڵدەکێشن، وەك چۆن جلێك لە ئاو یا لەڕەنگ هەڵدەکێشرێت، پێی دەگوترێت: ئەی ئادەمیزاد بە هەموو تەمەنت خۆشیت دیوە؟ ئەویش دەڵێت: نە بەخوا ئەی پەروەردگار! خۆشیم هەرگیس نەبینیوە، لەبەهەشتیانیش کامیان لە دونیادا لەو پەڕی تەنگانەو ناخۆشیدا ژیاوەو بە چەرمەسەری نانێکی دەست کەوتوە،(واتە: بەهەشتییەك) دەیهێننو لە بەهەشتی هەڵدەکێشن وەك چۆن جلێك لە ئاو یا لەڕەنگ هەڵدەکێشرێت، پێی دەوترێت: ئەی ئادەمیزاد بە هەموو تەمەنت ناخۆشیت دیوە؟ ئەویش دەڵێت: نە بەخوا ئەی پەروەردگار! نە ناخۆشیم بینیوەو نە چەرمەسەری".



# عیشقی موحەممەدی
# ڕازێك لە خزمەت ڕەسولی ئەکرەمدا

نوسینی: د.سەباح بەرزنجی

"ئــــەی پێغەمبەری شیرین کـردەوە
کەعبەت لە ژەنگی بت پاك کردەوە"

ئەمە بەشێکە لەو شیعرە جوان و بەرزانەی زانای گەورەی کورد شێخ موحەممەدی خـاڵ لـە مـەدح و پەسـەندکردنی ڕەسـووڵی ئەکرەمـدا هۆنیویەتیـەوە، ئـەو شـاکارە ئەدەبیانـەی لـە جیهـانی عیـشقی موحەممەددیـدا بەرهـەمهاتوون زۆرن. تـا دونیـا دونیایـە قەصیدەی بـەحری نـووری مـەحوی و چامە بەرزەکـەی نـالی و سۆزو ئەوینەکـەی خـاکیی و بێخـودو مـەلا موحەممـەدی چڕۆسـتانی وەسیقەی عیشق و عەلاقەی ئەم ئوممەتەن بە خەتمی نبووەتەوە، ئەمە لە زمان و ئـەدەبی کوردیـدا، لـە ئـەدەبیاتی گـەلانی ئیسلامی تریشدا موحیببـەتی ئـەم خۆشەویستە ئازیزە بابەت و خولگەیەکی سەرەکی و هەمیشەیی بـووە و هەیە، بەتایبەتی ئەدەبی فارسـی لـە سـەدەی دووەمـی کۆچییەوە تـا ئەگاتــە ئــەمڕۆ لــە بــاس و ســتایش و خۆشەویــستی پێغەمبــەری خۆشەویستماندا گەیشتووەتە لوتکەو بە چەندین شێوەو شێوازی ڕەوان و پاراو لە مەنزڵ و هـەواری تەیبـەی مەدینـەو بـەقیعی غەرقـەدی یاران هـەواریان خستووە، یـەك لـەو شاعیرو بیرمەنـدە گەورانـەی بە چاوی دڵ و بە پـەروازی گیـان باڵـە فرکێـی مـەزاری ڕەوزەی کـردووە و مەستبووە بەبای نەجدو حیجاز، موحەممەد ئیقبـالی لاهـووری شاعیرو فەیلەسووف و عارفی پاکستان بـووە، کـە بـە شیعرو بیرە ناوازەکـانی توانی زەنگی وریابوونەوە بـۆ گـەلانی خۆرهـەڵات لێبـداو بـە بـیردۆزەو گۆشەنیگاکانی بانگەشەی بۆ نوێبوونەوەو ڕابوونی مسوڵمانان کردو لە



هەمانکاتدا بە غـەزەل‌و مەنزوومـە عیرفانییـەکانی هـەوڵێکی زۆریدا بۆ ناشتنی نەمامی موحیببەتی پێغەمبەر(ﷺ)و یاران‌و ئالووبەیتی لە دڵی ئوممەتـدا. بۆیـە بەجێیـە تەرجەمـەی یـەکێك لـە مەسنەوییەکانی لـە کتێبـی( رمـوز بیخـود)ی بکەینـە دیـاری بـۆ خوێنـدەوارانی کـوردو هۆگرانی عیشق‌و ئەوینی نبووەت، بە ناونیشانی (عـرض حـال مـصنف بحضور رحمة للعالمين)

## ئەمەش دەقی پەرچڤەکەی موحەممەد ئیقباله بە دەستکارییەکی کەمەوە:

"دەرکـەوتنی تـۆ ژیـانی بووژانـدەوە، خـەونی دێرینـی مرۆڤـەکانی لێکدایەوە، زەوی بە هاتنت شانازی کردو ئاسمان بە تەماشای مەقامت نازی کرد، بوونەوەر بە تۆ باڵای کردو هەژاریی بۆت بوو بـە سـەرمایە، تـاکوو مەشخەڵی ژیانـت هەڵگیرساندو کۆیلـەکانت فێـری گـەورەیی‌و سـەروەریی کـرد، لـەم سـەراخانەی ئـاوو گڵـەدا تـا تـۆ نـەهاتبووی مرۆڤەکان شەرمەندەبوون، کە تۆش هـاتی ئـاگر بەربوویـە دڵـی خـاك‌و ڕوخساری جوانی مرۆڤایەتی دەرکەوت، زەوی ئەوەنـدە شادو خـوڕڕەم بـوو بـە مەقـدەمت، کـە تـەپ‌و تۆزەکـەی نـازی بەسـەر خـۆرو مانگدا دەکرد، بۆیە تـەماشای هەر ئەبووبەکرو عومەرێکت دەکرد لەبەر چاویدا لە باوك‌و دایکی خۆشەویستتر دەبـووی. مـن بـە عیشق‌و ئـەوینی تـۆ ئـاگرم تێبـەربووەو لـە تـاوی تـۆ گیـانم سـووتاوە. بـا بنـاڵێنم وەکـوو شمـشاڵ، چـونکە بـەو ناڵەیـە ماڵـە وێرانەکـەم ڕوونـاك دەبێتـەوە. خۆشەویستم بەم هەموو سۆزو ئەوینەوە ناتوانم خـەمەکانم بـشارمەوە، ئایا دەکرێ مەی لە بادەدا بشاردرێتەوە؟"

یەکەمین خـەمی مـن ئەوەیـە کـە مـسوڵمان لـە ڕازی تـۆ بێگانـە بـووە، بەیتولحەرامی دڵی ئەو جارێکی تر بووەتەوە بـە بتخانـە، لـە باخەڵیدا



چەندین بتی وەکو لاتو عوززاو مەناتو هوبەلی هەلگرتووەو پێشەواکانمان وازیان لە پێشەوایەتی هێناوەو سەریان بە خەیاڵی خاو قاڵکردووە، مسوڵمانان لە مەرگو ئەجەل ترساونو سینەیان دڵی تێدا نەماوە، وەك لاشەیەکی مردوو پێویستیان بە پزیشكو بە سەرۆکی پزیشکانە. ئەم ئوممەتە مردوویەکەو دەبێت باسی ئاوی حەیاتو ڕازێك لە ڕازەکانی قورئانی بۆ بکەم، چیرۆکی یارانی نەجدی بۆ بگێڕمەوە، بۆنو بەرامەیەك لەو بۆستانو گوڵستانە بڵاو بکەمەوە، بۆ ئەوەی مەحفەل بە مەشخەڵی نەوا ڕۆشن بکەمەوەو خەڵکی فێری ڕازو ڕەمزی ژیان بکەم.

لەم سەردەمەدا ئەفسوونی فەرەنگ ڕێگای دەربازبوونی لێگرتووینو بە هەراو بەزمی خۆی مەستو مەدهۆشی کردووین.

خۆشەویستم: تۆ بووەیسیریت خەڵاتکردو بەربەتی سەلمات بە من بەخشی، بۆیە داوات لێدەکەم کە بە منی خەتا ئەندێشو کاڵای خۆ نەناس چێژی ڕاستیم پێ عەتا بفەرموو، هەرچەندە دڵم ئاوێنەی بێ جەوهەرەو جگە لە قورئان لەناو وتەکانمدا شاردراوەتەوە.

ڕووناکی تۆ بەرەبەیانی هەموو ڕۆژگارو سەردەمێکەو چاوی تۆش زاخاودەری هەموو دڵو سینەیەکە، جا کەوابێت پەردەی ناموسی بیری من لەتو پەت بکەو ئەم ڕێبازە لە درکی بوونی من پاك بکەرەوە ! ، بەرگو پۆشاکی ژیان لە بەر مندا تەنگ بکەو ئەم ئوممەتە لە خراپەی من بپارێزە، دڵ پەرێشانو بەرواڵەت ئاوەدانم مەکە، بەهرەمەند لە هەوری نیسانم مەکە.

خۆشەویستم: لە چاکەی تۆ ناکەسان دەبن بە کەس، بۆیە تەنها دوعایەکی تۆ ببێتە بایی قسەکانم بۆ من بەسە.

لەخزمەتی پەروەردگاری کردگاردا تەنها ئەم داوایەم بۆ بکە، کە عیشقی من هاوئامێزی کردەوە بێت. تۆ کە دەوڵەتی گیانی غەمبارت

بەمن بەخشیوە، بەهرەیەك لەزانستی دینیشم پێ ببەخشە، لەکرداردا پایەدارترم بکە، من ئاوی نیسانم‌و بمگۆڕە بە گەوهەر!

کە پێم نایە جیهانەوە، ئارەزوویەکی ترم لە دڵدا بۆ دروستبوو، دڵم لە سینەمدا ئاسوودە بووەو لەگەڵ گزنگی بەیاندا بووەتە مەحرەم، لەو ساتەوە کە باوکم ناوی تۆی فێرکردووم ئاگری ئەم ئارەزووەم هەڵگیرساندووە، من دەمەوێت ڕۆژگار بە عیشقی تۆ دێرینترم بکاو لە مامەڵەی ژیاندا بەو عیشقە بمدۆڕێنێت، چونکە سەرەنجام ئەم ئارەزووەم تازەتر دەبێتەوەو ئەم بادە کۆنە گرانتر دەبێت، ئەم خۆزگەیە بۆ ژێر خاکی من دەبێتە گەوهەرو لەشەوی تاریکدا بۆم دەبێتە چرا.

خۆشەویستم، من ماوەیەك لەگەڵ جوانان‌و گوڵاڵە ڕووانیدا ژیاووم‌و دڵم بە پەرچەم لوولەکان داوە، لەگەڵ مانگ ڕوخساران بادەگوساریم کردووە لەسەر چرای عەیش‌و نۆش داوێنم تەکاندووە، بە بروسکەکان تەپ‌و تۆزی خەرمانم بەرباد بووەو ڕێگران کاڵای دڵمیان بە تاڵان بردووە، لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا نەیانتوانیوە ئەم شەرابی عیشقی تۆیە لە شووشەی گیانم بڕژێنن‌و ئەم زێڕە پاکە لە ناو کۆشم بڕفێنن.

عەقڵ‌و هۆشی ئازەر پیشەی من زەنناری بەست‌و نەقشی خۆی لە وڵاتی گیانی مندا کێشا، ساڵانێك گرفتای داوی گومان بووم‌و گومانێکی وا لێم جودا نەدەبوویەوە. ئەم عەقڵ و هۆشە پیتێك لە یەقینی نەخوێندبوو، لە گومان ئاوای حیکمەتدا گیری خواردبوو، لە تاریکییەکدا دەژیام کە لە هەتاوی حەق بێگانە بوو، لە ئێوارەیەکدا بەسەرم دەبرد کە بە تیشکی شەفەق ئاشنا نەبوو، بەڵام خۆزگەی دیداری تۆ لە دڵمدا ئارامی گرتبوو وەکوو گەوهەر لە صەدەفدا



داپۆشرابوو، تا سەرەنجام لە پەیمانەی چاوەکانمەوە تکایە خوارەوەو لە ناخمدا چ ئاوازێکی ئەفراند!
خۆشەویستم: گیانی من جگە لە یادی تۆ هیچ مرۆڤێکی تری تێدا نییە، ئەگەر فەرمانم پێبدەیت ئەوا باسی ئەو یادەی تۆ دەکەم، من چونکە لە ژیاندا هیچ سەرمایەیەکی کردەوەم نیە، بۆیە شایانی ئەم عیشقو ئارەزووەش نیم، تەنانەت شەرم دەکەم لە دەرخستنو باسکردنی، بەڵام لوتفو میهرەبانی تۆیە جورئەتی باسکردنیم پێدەدات.
بەزەیی تۆ هەموو جیهان دەلاوێنێت، بۆیە ئارەزوومە لە حیجاز بمرم.
من مسوڵمانێکم لە غەیری تۆ بێگانەم، تا بەکەی من زەننار بپۆشمو لەبتخانەبم؟
حەیفە ڕۆژگاری من تەواو ببێتو پەیکەری من لە کەناری تۆدا درەنگ وەربگیرێت!، بەڵام ئەگەر پارچەکانی من لە دەرگاکەی تۆدا کۆبکرێنەوە، ئای چەند خۆش دەبێت سبەینێی من.
چەندە خۆشە شارێك تۆی تیا ژیایو چەند پیرۆزە خاکێك تیا ئارام بووی؟
(مەسکەنی یارەو شاری شای منە) لای عاشق ئەمە ( حب الوطن )ە.
خۆشەویستم: بە ئەستێرەی بەختی من چاوێکی بێدار ببەخشە، بە منیش مەرقەدێك لە سای دیواری خۆتدا، تاوەکوو دڵی بێ تاوی من ئارامو بوونی وەك جیوەی من جێگیر ببێ.
بە ڕۆژگار دەڵێم : ئارام بەو ئینجا تەماشای منی مسوڵمان بکە.
تۆ کە سەرەتای منت بینیوە، ڕاوەستەو سەیری ئەنجامیشم بکە.





# لەبارەی موحەممەدەوە(ﷺ)، ئەوان چی دەڵێن؟

**ماهاتما گاندی (Mahatma Gandi)، چالاکوانی بواری مافی نەتەوەکان و دژی توندو تیژی (هندی):**

"ویستم سیفەت و خەسڵەتەکانی ئەو مرۆڤە بزانم کە بەبێ ناکۆکی بووەتە خاوەنی دڵی ملیۆنەها مرۆڤ، بۆیە بە تەواوەتی گەشتمە ئەو بڕوایەی کە شمشێر ئیسلامی نەگەیاندووەتە ئەم پایە بەرزە، بەڵکو سادەیی و وردبینیی و ڕاستگۆیی لە بەڵێن و دڵسۆزی و ئازایەتی موحەممەدو بڕوای تەواوی بە پەروەردگارو بەرنامەکەی ئیسلامی گەیاندە ئەم بڵندییەی ئێستەی".

**لیف تۆڵستۆی، ئەدیبی بەناوبانگی ڕوسی:**

" پەیام و بەرنامەکەی موحەممەد هەموو جیهان دەگرێتەوە، چونکە یەکانگیرە لەگەڵ ژیری و دانایی، ئەوەندە بەسە بۆ موحەممەد شانازی پێوە بکات کە نەتەوەیەکی ژێر دەستەو چنگ بە خوێنی لە ژێر دێوەزمەی داب و نەریتی دزێو ناشیرین ڕزگار کرد، لەبەردەم ئەم نەتەوەیەدا ڕێگای پێشکەوتن و سەربەرزی والا کرد".

**بەرناد شۆ، ئەدیبی بەناوبانگی بەریتانی:**

" پیاوانی ئاینی سەدەکانی ناوەڕاست بەهۆی نەزانی و دمارگیرییانەوە وێنەیەکی تاریکیان بەموحەممەد دابوو، بە دوژمنی مەسیحییەتیان دەناساند، بەڵام من لەم پیاوەم کۆڵیوەتەوە، زۆر پێی سەرسام بووم، بۆم دەرکەوت کە دوژمنی مەسیحییەت نەبوو، بەڵکو دەبێت بە ڕزگارکەری کەری مرۆڤایەتی ناو بنرێت، پێم وایە ئەگەر کاروباری جیهانی ئەمڕۆی پێ بسپێرێ چارەی هەموو گرفتەکان دەکات بە جۆرێك ئاشتی و ئاسایش و ئاسودەیی بۆ مرۆڤەکان دەگێڕێتەوە".



**بوسورث سمیث** (Bosworth Smith)،

"موحەممەد لە یەك كاتدا سەركردەیەكی سیاسیو پێشەوایەكی ئاینی بوو، فیزو لە خۆبایبوونی پیاوانی ئاینی پێوە دیار نەبوو، هەروەك لە شكرو سوپای قەیسەرەكانی نەبوو، هەروەها هێزی نیزامیو پاسەوانی تایبەتیو كۆشكو تەلارو داهاتی نەبڕاوەی نەبوو".

**ئان بیزیت** (Annie Besant):

"ئایا دەتەوێت پێم بڵێی: پیاوێك لە هەرەتی لاویەتیدایەو تەمەنی بیستو چوارساڵی نەبڕیوەو ئینجا بێوەژنێكی زۆر لە خۆی گەورەتر دەخوازێتو لەگەڵی دەبێت بۆ ماوەی بیستو شەش ساڵ تا تەمەنی دەگاتە پەنجا ساڵ كە تیایدا شەهوەتو ئارەزووی جنسی لاواز دەبێت، ئایا دەكرێت بگوترێت خێزانەكانی تری بۆ مەبەستی جنسی هێناوە؟ بەو جۆرە نابێت بڕیار لەسەر كەسەكان بدرێت.. ئەگەر سەیری ئەو ئافرەتانە بكەین كە خواستونییەتی دەبینین هەر یەكێك لەمانە هۆكاربوون بۆ بەستنی هاوپەیمانەتییەك كەلە بەرژەوەندی شوێنكەوتووانی تەواوبووە یان ئەو ئافرەتانەی كە خواستونییەتی زۆر پێویستییان بە پاراستنو پەناگەیەك بووە".

**لامارتین** (Lamartine)،**ئەدیبی فەرەنسی**

" كێ دەتوانێت یەكێك لە ناودارەكانی مێژوو لە بلیمەتیدا لەگەڵ موحەممەد بەراورد بكات؟... بەڵێ ئەمەیە موحەممەد: فەیلەسوف، وتاربێژ، یاسادانەرو شەڕكەر، دامەزرێنەری بیری یەكتاپەرستی، بە هەموو پێودانگێك دەمەوێت بپرسم: كەس هەیە لە موحەممەد گەورەتر؟"





**ڕاماکریشنا ڕاو (Ramakrishna Rao)،ئەدیبی دیاری هیندی:**

" ئـەوەتا موحەممـەد پێغەمبـەرە، موحەممـەد جـەنگاوەرە، پیـاوی کەسابەت‌و بازاڕە، سیاسەتمەدارە، وتاربێژە، چاکەکارە، پەناگەی بێ باوکانە، پارێزەری بەندەکانە، ئازادکەری ئافرەتانـە، دادوەرە، هـەموو ئەم سیفەتە بەرزانە لە هەموو بوارێکی ژیاندا دەیکەنە شایەنی ئـەوەی ببێتە پاڵەوان".

**تۆماس کارلایل (Th.Carlyle)، بیرمەندی دیاری ئینگلیزی:**

" بە زۆری ڕووی موحەممەد بە خەندەیەکی ڕاست‌و لە دڵەوە سەچاوە گرتوو ڕووناک بوو، زیـرەك‌و هۆشمەنـد بـوو، دلاوەرو جـوامێر بـوو، بـە سروشـت بـەرز بـوو، هـیچ قوتابخانەیـەك پێـی نەگەیانـد، لـە ژینـدا کارەکانی بەتەنها لەم قولایی بیابانەدا بە جێهێناوە... من موحەممەدم خۆشدەوێت چونکە دوور بووە لە خـۆ سـەلماندن‌و خـۆ نوانـدن، کـاری ئەمرۆی نەدەخستە بەیانی".

**واشنگتۆن ئیرفنج:**

" هـەڵسوکەوتی موحەممەد لە دوای ئازادکردنی مەککە بەڵگەن کە ئـەو پـەیامبـەرێکی نێـردراو بـووە نـەوەکو سـەرکردەیەکی سـەرکەوتوو لـە جـەنگ، چـونکە بەخـشندەیی‌و هاوسـۆزی خـۆی بـۆ هاوشـارییەکانی دەرخست ئەگەرچی بەهێز بوو، بەڵام سەرکەوتنەکەی تاجدار کرد بـە بەخشندەیی‌و لێبوردەیی....، لە دوای خۆی نە دینارێك نـە درهـەمێك یان کۆیلەیەکی بە جێنەهێشت، خودا لـە دونیـادا کلیلـی گـەنجینـەکانی دونیاو دواڕۆژی خستە بەردەستی، ئەو گەنجینەی دواڕۆژی هەڵبژارد".



ئەو شوێنەی
پێغەمبەر (ﷺ)
تیایدا پێشوازی لە
وەفدەکان دەکرد




شوێنی لەدایکبونی فاتیمەی کچی
پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ)



پێڵاوێکی پێغەمبەری
خۆشەویست (ﷺ)



ئەوحەوزە بەردینەی پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) دەستنوێژی تیا دەشۆرد




ئەوشوێنەی پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) وتاری تیا دەدا




نوێژگەی پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ)



دەرگای چونە ژورەوەی ژورەکەی پێغەمبەر (ﷺ)



شوێنی بەرپابونی جەنگی بەدری گەورە



ئەو خانوەی پێغەمبەر (ﷺ) ٢٩ساڵ تیایدا ژیا




خانوەکەی خەدیجەی خێزانی پێغەمبەر (ﷺ)



## سوپاسنامە

وێڕای بردنی کڕنوشی سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە کە لەسەرکەوتنی ئەم پڕۆژە پیرۆزەدا یارمەتیداین و کردنییە هۆکارێک بۆ خزمەتی زیاتری قوتابیان و گەنجەکانی میللەتەکەمان بە چاکترین دیاری و وتەی شیرین کە هی پێغەمبەری خۆشەویست و سەروەرمانن(ﷺ)، زۆر سوپاسی خۆمان ئاراستەی هەموو ئەو بەڕێزانە دەکەین کە هاوکارمان بوون بە ڕێگای جۆراو جۆر کە لە ڕاستیدا ژمارەیان هێندە زۆرە ئێمە دەرفەتی ناوهێنانیانمان نابێت و خوای گەورە خۆی ئاگاداری هاوکاری و یارمەتییەکانیانە بە تایبەتتر ئەوانەی ڕاستەوخۆ دەستیبیان لە پەیداکردنی تێچوون و خەرجی ئەم پڕۆژەیەدا هەبوو ئەوانەشی بە گرتنەوەی پارەی دەمی خۆیان هاوکار بوون، هەروەها هەموو ئەوانەشی دوعای خێریان بۆ کردین و هانیاندایین بۆ سەرخستنی پڕۆژەکە. دوو بارە سوپاس بۆ ئێوە.

### سەرچاوەکان:

بۆ نوسین و ئامادەکردنی ئەم کتێبە سود لەم سەرچاوانە وەرگیراوە:
(صحیح البخاری، صحیح المسلم، سیرة ابن هیشام، الرحیق المختوم، زاد المعاد، رحمة للعالمین، مختصر سیرة الرسول، فقه السیرة للامام الغزالی، گوڵاوی سەرمۆر، تەنها موحەممەد،الشبکة الاسلامیة، مفکرة الاسلام، اسلام اونلاین، شبکة السنة، شبکة العجیب)





# محمد صلى الله عليه وآله وسلم ... منهج الحياة

مشروع "محبي محمد ﷺ ..." بدعم من فاعلي خير

منظمة طلبة كوردستان

يهدى ولايباع

به دیاری دەبەخشرێت و نافرۆشرێت



چاپخانەی حاجی هاشم / هەولێر